بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

لەسەر داواکاری و بەپێویست زانین، ئەم ڕەشنوسەمان خستە بەردەم عومرەکاران تاوەکو زیاتر شارەزاتربن بەهیوای ئەنجام دانی ئەم مەراسیمە عیبادەتییە بەشێوەی ڕاست و دروستی شەرعی خۆی بە بەڵگەی ئایەت و فەرموودە صەحیحەکان.

داواکارین لە پەروەردگاری میهرەبان سەفەرو عیبادەتەکانتان لێ قبوڵ بکات و بیکاتە پاکبوونەوەو توێشووی ڕۆژی دوایی و بێبەشمان نەکات لە بەشداربوونی نزاو پاڕانەوەکانتان.

✍

أحمد ملا فائق

٥ / ٥ / ٢٠١٢ م

# پلـەو پاداشتی عومره

١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «العُمْرَةُ إِلَى العُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا». البخاري (١٧٧٣)، ومسلم (١٣٤٩).

واته: عومره تا عومرەیەك سڕینەوەی نێوانیانە.

٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَابِعُوا بَيْنَ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الكِيرُ خَبَثَ الحَدِيدِ، وَالذَّهَبِ، وَالفِضَّةِ... ». الترمذي (٦٥٠)، الصحيحة (١٢٠٠)، النسائي (٢٤٦٧)، ابن ماجة (٢٣٣٤).

واته: بەدوای یەكدا حەج و عومره بكەن،هەردووكیان هۆكاری نەمانی هەژاری و تاوانە ،وەكو ئاگر كە پاككەرەوەی پیسی ئاسن و ئاڵتون و زیوە.

٣. عن ابن عمر ﵄ عن النبي ﷺ قال: «الغازى في سبيل الله و الحاج و المعتمر و فدُ الله : دعا هم فأجابوه و سألوه فأعطاهم». صحيح سنن ابن ماجة (٢٣٣١)، والنسائي (٢٤٦٥).

واته: موجاهید و حاجی و عومرەكار نوێنەرن بۆ لای پەروەردگار بانگی كردن وەڵامیان دایەوە، چی داوا دەكەن پێیان دەبەخشێت.

٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «جِهَادُ الْكَبِيرِ، وَالصَّغِيرِ، وَالضَّعِيفِ، وَالْمَرْأَةِ: الْحَجُّ، وَالْعُمْرَةُ». صحيح سنن النسائي (٢٤٦٣)، صحيح الترغيب (١١٠٠).

واته: جیهادی تەمەن گەورە و بچوك و ئافرەت، حەج و عومرەیە.

٥. عن أبى هريرة رضي الله عنه قال رسول الله ﷺ: «من خرج حاجاً فمات كُتِبَ لَهُ أجر الحاج إلى يوم القيامة ومن خرج معتمراً فمات كُتِبَ لَهُ أجر المعتمر إلى يوم القيامة». صحيح الترغيب (١١١٤).

واته: كەسێك بچێت بۆ حەج و لە ڕێگادا بمرێت پاداشتی حەجی بۆ دەنوسرێت تا ڕۆژی دوایی، وە كەسێك بچێت بۆ عومرە و لە ڕێگادا بمرێت پاداشتی عومرەی بۆ دەنوسرێت تا ڕۆژی دوایی، واتە هەتا ڕۆژی دوایی هەر لە حەج و عومرەدان.

٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أن رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قال: «عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي». البخاري (١٨٦٣)، ومسلم (١٢٥٦).

واته: عومرەیەك لە ڕەمەزان دا وەكو حەجێك وایە لەگەڵ مندا كردبێتی.

# ڕوکنەکانی عومرە

١. ئیحرام، واتە: نیەت و ووتنی (التلبیة): لبیك اللهم بالعمرة.

٢. تەوافی کەعبە.

٣. سەعی نێوان سەفا و مەروە.

واتە: عومرە بە بێ ئەمانە هەڵدەوەشێتەوە

# واجبەکانی عومرە

١. پۆشینی ئیحرام لە میقاتەوە.

٢. سەر تاشین یان کورت کردنەوە.

واتە: بەبێ ئەمانە عومرە ناتەواوە و بە (فدیة) پڕ دەبێتەوە.

# سونەتەکانی عومرە

بێجگە لە بەشەکانی ڕوکن و واجب چیتر باس دەکرێت سونەتن و بە نەکردنیان لە پاداشت و تەواویی عومرەکە کەم دەبێتەوە، بەدەر لە نەزانین و هەڵە و لەبیرچوون.

• پێویستە موسوڵمان کە دەیەوێت عومرە بکات کاتێك دەگاتە میقات (ذوالحليفة) ئەم کارانە ئەنجام بدات:

## ١. خۆشۆردن (غسل):

خۆی بشوات وەکو چۆن بۆ غوسلە شەرعییەکان خۆی دەشوات، وە پێش خۆشۆردن پێویستیەکانی موو بڕین و نینۆك کردن ئەنجام بدات، لەبەر ئەوەی نەکەوێتە ناو قەدەغەکراوەکانی ئیحرامەوە.

* تەنانەت ئەو ئافرەتانەی لە وادەی سوڕی مانگانەدان یاخود لە دوای منداڵ بوون دان، واجبە خۆیان بشۆن و بەرگی ئیحرام بپۆشن و بەشداری هەموو جۆرەکانی مەراسیمی عومرە بن، بێجگە لە تەوافی کەعبە و سەعی سەفا و مەروە، ئەوانە دوای تەواو بونیان لە سوڕی مانگانە ئەنجام دەدەن، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْحَائِضُ وَالنُّفَسَاءُ إِذَا أَتَتَا عَلَى الْوَقْتِ تَغْتَسِلَانِ، وَتُحْرِمَانِ وَتَقْضِيَانِ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا غَيْرَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ». صحيح سنن أبي داود (١٥٣٤) الترمذي (٧٥٤).

## ٢. پۆشینی ئیحرام:

پیاوان دەبێت هەموو بەرگێك لە خۆیان دامالّن، هیچ پارچە پۆشاکێکیان پێوە نەمێنێت بێجگە لەو دوو پارچە پۆشاکەی کە پێی دەوترێت (ئیحرام).

* ئافرەتان بۆیان هەیە هەموو جۆرە پۆشاکێك بپۆشن لە جۆر و ڕەنگ، بێجگە لە دەستکێش و نیقاب نەبێت وە هەرپارچەیەك کە دەم و چاوی پیێ هەڵبپێچرێت، بەڵام ئەگەر پارچە قوماشێك لەسەریەوە دایباتەوە بەسەر دەم و چاوی دا بەبیێ هەڵپێچان دروستە.

* بەرگی ئیحرامی پیاوان و ئافرەتان نابێت هیچ جۆرە بۆنێکی پێوەبێت.

* دوای پۆشینی ئیحرام قەدەغەیە پیاوان سەریان داپۆشن بە کڵاو و جامانە و هەرپارچەیەکی تر بێت، یاخود گۆرەوی و خوف و پێڵاو لەپیێ بکەن بێجگە لە نەعل نەبێت، وە دەبێت شانی ڕاستیشی داپۆشێت: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: ((لاَ يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ الْقَمِيصَ، وَلاَ الْعِمَامَةَ، وَلاَ السَّرَاوِيلَ، وَلاَ الْبُرْنُسَ، وَلاَ ثَوْبًا مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ وَلاَ وَرْسٌ، وَلاَ الْخُفَّيْنِ إِلَّا لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ،...)). البخاري (١٥٤٢)، ومسلم (١١٧٧).، ((وَلاَ تَنْتَقِبِ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلاَ تَلْبَسِ الْقُفَّازَيْنِ)). البخاري (١٨٣٨).

* بە پۆشینی بەرگی ئیحرام ناچێتە ناو مەراسیمی (عبادة) عومرە تاوەکو بە زمان نەلێت (لبیك اللهم بالعمرة) خودایە ئامادەم عومرە بۆ تۆ بکەم، واتە پێش ووتنی ئەمە ئەگەر پەشیمان بێتەوە لە عومرەکردن بە هیچ جۆرێك تاوانبار نابێت و فدیەی لەسەر ناکەوێت.

# التلبية

دەتوانرێت دوای پۆشینی ئیحرام و (التلبیة) کە پێی داخل ئەبیتە ناو عومرە، عومرەکار خۆی بشوات و بەرگی ئیحرام بگۆڕێت و سەری شانە بکات بێجگە لە نینۆك کردن و موو لێکردنەوە و بۆنی خۆش لەخۆدان و نزیك بوونەوە لە خێزان نەبێت کە ئەمانە هەمووی لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرامن.

ئەگەر یەکێك گومانی هەبوو لە تەواو کردنی عومرەکەی بەهۆی نەخۆشی و ڕووداوێکەوە، دەتوانێت لەکاتی ووتنی (التلبیة) مەرج دابنێت و بڵێ (ئامادەم پەروەردگار عومرە بکەم بەمەرجێك هەرکاتێك هۆکارێکی ڕێگر هەبوو دەرچم لە ئیحرام)، ئەوا ئەگەر بۆی تەواو نەکرا تاوانبار نابێت و فدیەی لەسەر ناکەوێت وەك لەم فەرموودەیەدا

هاتووه: عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ لَهَا: «لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الحَجَّ؟» قَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ أَجِدُنِي إِلَّا وَجِعَةً، فَقَالَ لَهَا: " حُجِّي وَاشْتَرِطِي، وَقُولِي: اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي". البخاري (٥٠٨٩)، ومسلم (١٢٠٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای زوباعەی کچی زوبێر و فەرمووی: ڕەنگە ویستی حەجت بوو بێت، وتی: بەردەوام نەخۆشم و ئازارم هەیە، فەرمووی: حەج بکە و بە مەرجی بگرە و بڵێ: ئامادەم حەج بکەم بە مەرجێك هەر ڕێگرێك هەبوو دەرچم لە ئیحرام.

* دەتوانرێت پۆشاکی ئیحرام بپۆشرێت پێش (میقات) کە (ذو الحليفة)یە پێی دەڵێن (أبيار علي) بە مەرجێك، نابێت تا دەگەنە میقات نیەت و ووتنی (التلبية) بێنن.

تاوەکو (التلبية) نەڵێن ناچنە ناو مەناسیکی عومرەوە، لەبەرکردنی ئیحرام وەك دەستنوێژ گرتن وایە بۆ نوێژ وە ووتنی (التلبية) وەکو (الله أكبر)ی دابەستنی نوێژ وایە.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «انْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ المَدِينَةِ بَعْدَ مَا تَرَجَّلَ، وَادَّهَنَ وَلَبِسَ إِزَارَهُ وَرِدَاءَهُ هُوَ وَأَصْحَابُهُ». البخاري (١٥٤٥).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە دەرچوو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا پاش لەبەرکردنی ئیحرام و قژ داهێنان و چەورکردنی.

* نوێژی سونەتی پاش پۆشینی ئیحرام، وەکو سونەت هیچ فەرموودەیەکی لەسەر نەهاتووە، بەڵام دەتوانرێت دوو ڕکاتی دەستنوێژ بێت یاخود چوونە مزگەوت بێت، یان هەر سونەتێکی تر بێت لە مزگەوتەکەی (ذو الحليفة) بکەیت و بەڵکو نوێژ کردن لە میقاتی (ذو الحليفة) سونەتە و شوێنێکی بەبەرەکەتە وەك لەم فەرموودانەدا هاتووە:

عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِوَادِي العَقِيقِ يَقُولُ: «أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي، فَقَالَ: صَلِّ فِي هَذَا الوَادِي المُبَارَكِ». البخاري (١٥٣٤).

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوای لێ ڕازی بێت ووتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمشەو نێردراوێك لای پەروەردگارمەوە هات و ووتی نوێژ لەم شیوە بەرێز و بەرەکەت دارەدا بکە.

عن ابن عمر رضي الله عنهما قيل له: «إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ». البخاری (١٥٣٥).

واتە: تۆ لە شوێنێکی تەختایی بەبەرەکەت دایت.

وفي رواية: «كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْكَعُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْن». مسلم (١١٨٤).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی لە (ذو الحليفة) میقات کرد.

* پاش نوێژەکە هەر لە سنووری مزگەوتی (ذو الحليفة) دا ڕوو بکەرە قیبلە و بڵێ (لبيك اللهَّم بالعمرة)، (لا رياء فيها ولا سمعة) ئامادەم پەروەردگار عومرە بکەم بە بێ ڕیا و دەربڕین.

* لەدوای وتنی ئەمەی پێشوو دەچێتە ناو مەراسیمی عومرەوە، واجبە بەردەوام بوون لەسەر ووتنی (التلبية) بە گوێرەی توانا و تێکەڵکردنی زیکر و نزا و قورئان خوێندن لە نێوانیاندا، بەمەرجێك هەر یەکێك بۆ خۆی بیکات بە دەنگی بەرز، (التلبية)ش بریتیە لە «لَبيكَ اللهَّم لَبيك، لَبيكَ لا شَريكَ لَّكَ لَّبّيك، إِنَّ الحَمْدَ وَّ النِعْمَةَ لَكَ وَالُملك، لا شَريكَ لَك».

واتە: ئامادەم خوای پەروەردگار ئامادەم، هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نییە و هەموو سوپاس و ستایش و نیعمەتێك بۆ تۆیە لەگەڵ هەموو موڵك و بونێکدا، هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نییە.

دەبێت ئەم زیکرە کە شیعاری عومرە و حەجە، زۆر و بەردەوام زیکری سەر زوبانی بێت تا دەگاتە (مەککە) یاخود بەردەم (حجر الأسود).

* دەتوانرێت ئەم جۆرانەش تێکەڵی (التلبية) بکرێت:

١. «لَبَّيْكَ لَبَّيْك، وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْك، لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَل». البخاري (١٥٤٩)، ومسلم (١١٨٤).

٢. «لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ». صحيح سنن النسائي (٢٥٧٩).

٣. «لَبَّيْكَ ذَا الْمَعَارِجِ، وَلَبَّيْكَ ذَا الْفَوَاضِلِ». أبوداود (١٥٩٠)، السنن الكبرى للبيهقي (٩٠٣٢).

سوننەتە ئەم زیکرانە هەر یەکە بۆ خۆی بیکات بە دەنگی بەرز، بە بەڵگەی ئەم فەرموودانە:

١. «أَتَانِي جِبْرِيلُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي وَمَنْ مَعِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَة». صحيح أبي داود (١٥٩٢).

واتە: جبریل سەلامی خوای لێبێت هات بۆ لام و فەرمانی پێدام فەرمان بدەم بە هاوەڵانم و ئەوانەی لەگەڵمن دەنگ بەرزکەنەوە بە (التلبية).

٢. «أفضل الحجّ و العجُّ و الثجُّ». صحيح الجامع الصغير (١١١٢).

واتە: باشترین (حەج، العجُّ)، واتە دەنگ بەرزکردنەوەیە بە (التلبیة)، وە الثجُّ: خوشەی خوێن ڕشتنی قوربانییە.

**٣. ((ما من مُلبي يلبي الا لبّى ما عن يمينه و عن شماله من شجر و حجر حتى تنقطع الارض من هنا و هنا)).** صحيح الترغيب (١١٨/٢).

واتە: هەر کەسێك (التلبیة) بلێت هیچ شتێك نییە لای ڕاستی و چەپی لە درەخت و بەرد و هەرچی لەملا و لەولایدایە هەموو وەکو ئەو (التلبیة) دەڵێنەوە.

**٤. ((كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ هَابِطًا مِنَ الثَّنِيَّةِ، وَلَهُ جُؤَارٌ إِلَى اللهِ بِالتَّلْبِيَةِ)).** البخاري (٣٣٥٥)، ومسلم (١٦٦).

واتە: هەروەك ببینم موسا سەلامی خوای لێبێت لەسەر تەپۆڵکەیەك دێتە خوارەوە و بە دەنگی بەرز (التلبیة) دەڵێت.

وەك (ئەبو حازم) دەفەرموویێت: (هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە دەنگی بەرز دەیانوتەوە نەدەگەیشتنە مەککە دەنگیان دەنوسا). رواة ابن شبية الفتح (٣٣٢٤)، وسعيب بن منصور ( ٧/٩٤).

ئافرەتان دەبێت ئەوەندەی کە خۆیان و هاوەڵانیان ببیستن دەنگ بەرز بکەنەوە.

### ٣. چۆنیەتی چوونە ناو مزگەوتی (حەرەم):

### پێویستە ڕەچاوی ئەم شێوازانەی خوارەوە بکرێت:

بێگومان حەرامە و نابێت ئافرەتان کە لە سوڕی مانگانەدان بچنە ناو مزگەوتی حەرەم و تەواف ئەنجام بدەن، هەروەك پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی خێزانی فەرموو: «فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِي». البخاري (٢٩٤)، ومسلم (١٢١١).

واتە: دەبێت هەموو کارێك کە حاجی دەیکات ئەنجامی بدەیت (لە خۆشۆردن و ئیحرام و تەلبیە) بێجگە لە تەواف نەبێت هەتا خۆت دەشۆیت (واتە تەواو دەبیت).

قاچی ڕاستت پێش بخە و بڵێ: «فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ». أبو داود (٤٦٥)، وإبن ماجة (٧٧٢).

بسم الله بکە و سلاوات لە پێغەمبەر ﷺ بدە و بڵێ: پەروەردگار دەرگای بەزەیی خۆتم بۆ بکەیتەوە.

### یاخود ئەم زیکرە بکە:

«أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ». أبو داود (٤٤١).

ئەگەر کەعبەت لێدەرکەوت بوەستە و هەردوو دەستت هەڵبڕە و ڕووە و کەعبە دوعا بکە، وە ئەگەر دوعاکەی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ بکەیت باشترە: «اللهُّم أَنت السلام و منك السلام فحّينا ربّنا بالسلام». مناسك الحج للألباني ص ٢٠.

واتە: خوای پەروەردگار تۆ ناوت سەلامە و سەلامەتی هەر لای تۆوەیە، بمان ژیێنە بە سەلامەتی.

بەم شێوەیە ئیمامی عومەر و عبداللە ی کوڕی عباس ﵄ دەستیان بەرز کردوٚتەوە و دوعایان کردووە لەکاتی بینینی کەعبەدا.

## تەوافی کەعبە

بەرەو (حجر الأسود) دەڕۆیت تا دەگەیتە بەردەمی، کاتێك گەیشتیتە بەردەم (حجر الأسود) لەسەر ڕای عبداللە ی کوڕی عباس ﵄ کۆتایی بە (التلبية) دێت، وە پاشان دەست دەکەیت بەم کارانە:

* شانی ڕاستت دەردەخەیت.

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابَهُ «اعْتَمَرُوا مِنَ الْجِعْرَانَةِ فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ وَجَعَلُوا أَرْدِيَتَهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ قَدْ قَذَفُوهَا عَلَى عَوَاتِقِهِمُ الْيُسْرَى». صحيح سنن أبي داود (١٦٥٩) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی کە عومرەیان کرد ئیحرامەکانیان دا بەسەر شانی چەپیاندا و شانی ڕاستیان دەرخست.

* بەرەو (حجر الأسود) بڕۆ ئەگەر گونجا و بۆت ڕەخسا دەستی لێ بدە و ماچی بکە و سوجدەی لەسەر ببە.

عَنْ إبن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا : «يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَبَّلَ يَدَهُ، وَقَالَ: مَا تَرَكْتُهُ مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُه». مسلم (١٢٦٨).

واتە: عبدالله ی کوڕی عومەر رضي الله عنه دەستی دەدا لە (حجر الأسود) و ماچی دەکرد و دەیوت وازم لێنەهێناوە لەو کاتەی پێغەمبەر ﷺم بینیوە کردوویەتی، وە ئیمامی عومەر و عبدالله ی کوڕی عباس رضي الله عنهم سوجدەیان لەسەر بردووە. الإرواء (١١١٢).

ئەگەر نەڕەخسا ماچی بکەیت، دەستی لێبدە و دەستت ماچ بکە، ئەگەر ئەوەشت بۆ نەکرا ئەوا دەستی ڕاستت هەڵبڕە و هەموو ڕووی

جەستەتی تێبکە وەك سلام لێکردنی و بلێ (بسم الله الله أكبر) یاخود هەر (الله أكبر).

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَإِذَا انْتَهَى إِلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ». صحيح سنن النسائي(٢٩٥٥).

عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: «طَافَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْبَيْتِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِمِحْجَنِهِ». مسلم (١٢٧٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی دا تەوافی کرد بەسەر حوشترەکەیەوە و بەسەری گۆچانەکەی دەیدا لە (حجر الأسود) و ماچی ئەکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری کوڕی خەتتابی فەرموو: «ئەی عومەر تۆ پیاوێکی بەهێزی ئازاری لاواز مەدە، ئەگەر چۆڵ بوو ئەوا دەستی لێ بدە، وە ئەگەر نا ڕووی تێبکە و "الله أكبر" بکە»، «وإلا فاستقبله و كَبِّر». الترمذي و إبن خزيمة و البيهقي (٥/٨٠).

وە عبدالله ی کوڕی عومەریش لە کاتی (حجر الأسود) دا دەیوت: «بسم الله، الله أكبر». عبدالرزاق (٨٨٩٤)، والبيهقي (٥/٧٩).

وە عبدالله کوڕی عباس دەفەرموێ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ بِالْبَيْتِ وَهُوَ عَلَى بَعِيرٍ، كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ، وَكَبَّرَ». البخاري (١٦١٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی ئەکرد و هەرکاتێك بگەیشتایەتە ئاستی (حجر الأسود) ئیشارەتی ئەکرد بە شتێ بە دەستیەوە بووە و (الله أكبر)ی دەکرد.

پاشان کەعبە بخەرە لای چەپتەوە و (حەوت) جار تەوافی کەعبە ئەنجام بدە، پیاوان سێ تەوافی سەرەتا دەبێت بە (هەرولە) ڕۆشتنی خێرا ئەنجامی بدەن و چوار تەوافەکەی تر بە ڕۆشتنی ئاسایی، وە لە هەر حەوت تەوافەکەدا دەبێت شانی ڕاستیان دەرکەوێت.

هەموو تەوافێك لە (حجر الأسود) دەست پێدەکات و دەبێت هەر لەوێش کۆتایی پێبێت، وە سەرەتای هەموو تەوافێك دەبێت هەموو ڕووت بکەیتە (حجر الأسود) و دەستی ڕاستت هەڵبڕیت وەك سەلام کردن بۆی و بڵێ (الله أكبر).

عَنْ ابْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ، «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ بِالبَيْتِ مُضْطَبِعًا». صحيح سنن الترمذي (٦٨٢).

واتە: هەموو حەوت تەوافەکانی بە شانی ڕووت بوو.

عَنْ إبن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: «رَمَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ ثَلَاثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا».مسلم (١٢٦٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کەعبەی ئەنجامدا شانی دەرکەوتبوو، وە سێ جار بە (هەرولە) ڕۆشتنی خێرا تەوافی ئەنجامدا و چوارەکەی تر بە ڕۆشتنی ئاسایی.

* گەیشتن بە ئاستی (ركن اليماني) کە دەکەوێتە سوچی ڕاستی پێش (حجر الأسود)، سونەتە دەستی پیا بهێنیت بەبێ ماچکردن و وتنی (الله أكبر)، ئەگەر نەتتوانی بەجێی دەهێڵیت بەبێ دەست هەڵبڕین و وتنی (الله أكبر).

«مَسْحُ الْحَجَرِ الأسود وَالرُّكْنِ الْيَمَانِيِّ يَحُطَّان الْخَطَايَا حَطًّا».الترمذي (٩٥٩)، صحيح الترغيب (١١٣٩).

واتە: دەست لێدانی (الحجر الأسود و الركن اليمانى) تاوان دەسڕێتەوە.

عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: «لَمْ أَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُ مِنَ البَيْتِ إِلَّا الرُّكْنَيْنِ اليَمَانِيَيْنِ».البخاري (١٦٠٩)، ومسلم (١٢٦٧).

واتە: ئیمامی عومەر دەفەرموێت نەمبینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەست بدات لە سوچەکانی کەعبە بێجگە لە (الحجر الأسود و الركن اليماني) نەبێت.

ئەم دەست لێدانە دەتوانێت لە هەموو تەوافێك دا ئەنجامی بدات.

کاتێك تێپەڕ بوویت لە (الحجر الأسود) بەرەو (ركن اليماني) لە نێوانیاندا ئەم زیکرە بخوێنە: «رَبَّنا آتِنا في الدُّنْيا حسنة و في الآخرةِ حسنة وَقِنا عذاب النَّار»صحيح سنن أبي داود (١٦٥٣).، هەروەك عبدالله ی کوڕی عومەر دەیگێڕێتەوە، بێجگە لەم زیکرە هیچ جۆرە زیکر و نزایەکی دیاریکراومان نیە، بەڵکو هەموو کەس دەتوانێت چی دەزانێت لە زیکر و دوعا بیخوێنێت.

نابێت سەرقاڵ بیت بە قسە و بابەتی دونیاییەوە لە کاتی ئەنجامدانی حەوت تەوافەکەدا، لەبەر ئەوەی لە ناو (عبادة) دایت.

«الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلَاةٌ وَلَكِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَحَلَّ فِيهِ الْمَنْطِقَ، فَمَنْ نَطَقَ فَلَا يَنْطِقْ إِلَّا بِخَيْرٍ». النسائي (٢٩٢٢).

واتە: تەوافی کەعبە نوێژە بەڵام خوای گەورە ڕێگەی داوە بە قسەکردن تێیدا، ئەگەر کەسێك قسەی کرد با قسەی خێر نەبێت نەیکات.

وە لە گێڕانەوەیەکدا فەرمووی: «**فأقلوا فيه الكلام**».رواة الطبراني، وفي الإرواء (١٢١).

واتە: با قسەی کەمی تێدا بکەن.

بە تەواو کردنی تەوافی حەوتەم و گەیشتنەوەت بە ئاستی (الحجر الأسود) پێویست ناکات ڕووبکەیتەوە (الحجر الأسود) و دەست هەڵبڕیت و (الله أكبر) بکەیت، لەبەر ئەوەی ئەمانە کاری سەرەتا کردنەوەی تەوافە، تۆ تەوافێکی تر بێجگە لە حەوتەکە ئەنجام نادەیت.

پاش حەوت تەوافەکە پیاوان شانیان دادەپۆشن:

عَنْ يَعْلَى بن أُمَيةَ: «**أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ مُضْطَبِعًا**». صحيح أبي داود (١٦٥٤)، وإبن ماجة (٢٩٥٤).

واتە: پێغەمبەری خوا تەوافەکەی بە شان دەرکەوتنەوە بووە.

هەندێك بە هەڵەدا چوون کە دەڵێن دەبێت لە دوای سێ تەوافەکەی سەرەتا کە (هەروەلە)ی تێدا کۆتایی دێت، شان ڕووت کردنیش تیایدا کۆتایی دێت، بەڵکو زۆربەی ڕای زانایان لەسەر

خوێندنەوەی ڕووکەشی فەرموودەکەن کە دەفەرموێت (طاف) واتە تەوافەکەی ئەنجامدا وە تەوافیش بە هەر حەوتی دەوترێت.

بڕوانە ئەم سەرچاوانەی زانایان بۆ دڵنیابوونت:

١. سبل السلام للصنعاني ج٢ ص٩٨٦.
٢. المغني لإبن قدامة ج٤ ص٥٥٩.
٣. فتاوى اللجنة الدائمة ج١١ ص٢٢٥.
٤. توضيح الأحكام شرح بلوغ المرام للعبدالله بسام ج٣ ص٣٧.
٥. حجة النبي صلى الله عليه وسلم للألباني ص٥٨.

* بەرەو (مقام إبراهيم) دەڕۆن، کە گەیشتنە (مقام إبراهيم) سونەتە ئەم ئایەتە بخوێندرێتەوە ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ [البقره: ١٩٥]., پاشان دوو ڕکات نوێژ بکە و لە ڕکاتی یەکەم دا سورەتی (قل يا أيها الكافرون...)ی تێدا بخوێنە و لە ڕکاتی دووەمیش دا سورەتی (قل هو الله أحد...) بخوێنە.

ئەگەر گونجا (مقام إبراهيم) بخەرە نێوان خۆت و کەعبەوە، ئەگەر دووریش بیت لێی، وە ئەگەر نا لەهەر شوێنێکی مزگەوت بێت دروستە، لحديث جابر رضي الله عنه: «ثُمَّ نَفَذَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَام، فَقَرَأَ "وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى"، فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْت فكَانَ

يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ "قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ" وَ "قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُون" )).مسلم (١٢١٨)، خجة النبي ﷺ للألباني ص٥٨ .

باش وايە لە شوێنێك دا نوێژ بكەيت كە كەس بە بەردەم نوێژەكەت دا تێپەڕ نەبێت، وە هەوڵ بدە بە بەردەم هيچ نوێژ خوێنێك دا تێپەڕ نەبيت، لەبەر ئەم هەڕەشەيەی لەم فەرموودەيەدا هەيە: ((لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ)).البخاري (٥١٠)، ومسلم (١١٣٢).

واتە: ئەگەر بزانێت تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژ خوێنێك دا چەند تاوانبار دەبێت چل ساڵ بوەستێت باشترە لەوەی تێپەڕبێت.

* دوای لێبونەوەی نوێژەكە بەرەو ئاوی زەمزەم بڕۆ لێی بخۆرەوە بەهەر نييەتێكی تايبەتيت بێت دێتە دی و هەندێكی بكە بە سەرتا و تەڕی بكە.

باشترين شێوازی خواردنەوە و نييەت، شێوازەكەی عبدالله ی كوڕی عباسە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كە دەفەرموێت: ((ئەگەر خواردت ڕوو بكەرە قيبلە و ناوی خوای لەسەر بێنە و بە سێ جار بيخۆرەوە، وە كە لێبويتەوە سوپاسی خوا بكە لەسەری،...وە بڵێ: "اللهُّم إني أسألك علماً نافعاً وعملاً متقبلاً و رزقاً واسعاً و شفاءً من كل داء")).الإرواء (١١٢٥،١١٢٦).

واتە:خوای پەروەردگار داوای زانستی بەسود و کاری وەرگیراو و ڕۆزی فراوان و شیفات لـە هەموو دەردێك لـێدەکەم.

((ماء زمزم لما شُرب له)).الصحيحة (٨٨٣).

واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئاوی زەمزەم بۆ هەر نییەتێکە.

((إنها مباركة وهي طعام طعم و شفاء سقم)).الصحيحة (١٠٥٦).

واتە: زەمزەم بەبەرەکەتە و خۆراکی برسییە و شیفای نەخۆشییە.

* پاشان بگەڕێرەوە بۆ (حجر الأسود) دەستی لـێدە و ماچی بکە، ئەگەر نەتتوانی لـە دوورەوە دەستی بۆ هەلـبڕە و (الله أكبر) بکە.

((ثم رجع إلى الركن فأستلمه)).حجة النبي ﷺ للألباني ص٥٨.

جابر دەفەرموێت: پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ (حجر الأسود) و دەستی لـێدا.

# سەعی نێوان سەفا و مەروە

تەوافی نێوانیان حەوت جارە، بەرەو بەرزایی سەفا بڕۆ و کە گەیشتیتە سەر بەرزایی سەفا ئەم ئایەتە بخوێنە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ [البقرە: ١٥٨].

ڕوو بکەرە کەعبە و ئەم زیکرە بخوێنە: «الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا إِلهَ إِلا الله وَحدهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلكُ وَ لَهُ الحَمدُ يُحيي وَ يُميتُ وَهُوَ عَلى كُلِ شَيءٍ قَدير، لا إِلهَ إِلا اللهُ وَحْدهُ أَنْجز وَعْدَهُ وَ نَصَرَ عَبْدَهُ وَ هَزَمَ الأَحْزاب وَحْدهُ».

پاشان دەست هەڵبڕە و نزا و دوعا بۆ خۆت بکە، و جاری دووەمیش بیلێرەوە و لە دواییدا دەست هەڵبڕە و دوعا بکە، وە سێهەم جاریش بیلێرەوە، بەڵام لە دواییدا دوعا مەکە و بڵێ: «أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِه». مسلم (١٢١٨).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وا دەست پێدەکەم کە خوای پەروەردگار دەستی پێکردووە، واتە لە باسدا کە (سەفای پێش مەروە) باس کردووە منیش لە پێشدا دەچمە سەر سەفا و پاشان مەروە.

* پاشان بەرەو (مەروە) بکەوەرە ڕێ بە شێوازی ئاسایی تا دەگەیتە ئاستی گلۆپە سەوزەکە، دەبێت پیاوان لە نێوان هەردوو گلۆپە سەوزەکەدا (هەروەلە) و ڕاکردنی هێواش بکەن بێجگە لە ئافرەتان، لە دوای کۆتایی گلۆپە سەوزەکە بە شێوازی ئاسایی ڕێ بکە تا دەگەیتە سەر بەرزایی (مەروە).

لە نێوان سەفا و مەروە هیچ زیکر و نزایەکی دیاریکراو نییە، بێجگە لە نزاکەی عبدالله ی کوڕی مسعود و عبدالله ی کوڕی عباس رضي الله عنهم کە دەیانووت: «رَبِّ اغفِر وَارْحَمْ إنَكَ أَنْتَ الأعَزّ والأَكْرَم». مناسك الحج للألباني ص٢٧.

واتە: پەروەردگار داوای لێخۆشبوون و بەزەییت لێ دەکەم، تۆ باڵادەست و بەخشندەیت.

* گەیشتیتە سەر بەرزایی (مەروە)، بەبێ خوێندنی ئایەتەکە "روايه جابر عند النسائى رقم (٢٩٧٤)"ڕوو بکەرە کەعبە و زیکرەکە بە شێوازی پێشوو بڵێرەوە و لە نێوان یەکەم و دووەمدا دەست هەڵبڕە و نزا و دوعای تایبەتی

خۆت بکە و لە دوای سێهەم جار دوعا ناکەیت، بەرەو سەفا بەهەمان شێوە بەرێدەکەویت و لە نێوان گلۆپە سەوزەکەدا لە هەموو تەوافێك دا ڕاکردن و هەرولە دەکات پیاوان.

* بەم شێوەیە لە سەفاوە بۆ مەروە تەوافی یەکەمە و لە مەروەشەوە بۆ سەفا تەوافی دووەمە، تاوەکو حەوتەم جار لەسەر مەروە کۆتایی دێت.

هەندێك بەهەڵەدا دەچن لە سەفا و چوونەوە سەر سەفا بە تەوافێك دادەنێن کە ئەمە دەکاتە چواردە تەواف، وە حەوت تەوافیش واجبە، هەموو نێوانی سەفا و مەروە تەوافێکە...بە بەڵگەی خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ١٥٨]. لە سەفاوە بۆ مەروە یەکێکە لە نیشانە و شیعار و فەرمانی خوایی بۆ (حەج و عومرە).

تەوافی (کەعبە) حەوتە کە ڕوکنە چ جای تەوافی نێوان سەفا و مەروە کە واجبە لە لای کۆی زانایان.

تەوافی (کەعبە) خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلْيَطَّوَّفُواْ بِٱلْبَيْتِ﴾ [الحج: ٢٩]. بە فەرمان، بەڵام بۆ سەفاو مەروە

دەفەرمووێت: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ﴾ [البقرة: ١٥٨]. کە فەرمان نییە، ئەوەی فەرمانە حەوت تەوافە و ئەوەی فەرمان نییە چواردەیە چۆن دەبێت کاری وا؟!

بۆ کەعبە و سەفا و مەروە بە یەك شێوە ڕیوایەتەکان دەفەرموون تەوافی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ: «طَافَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ». صحيح النسائي (٢٩٧٥).

واتە: تەوافی بە کەعبە و سەفا و مەروە کرد لە (حجة الوداع)، واتە هەردووکیان حەوت تەوافن.

تەوافی کەعبە لە (قران) دا دوو جار دەکرێت بەڵام تەوافی سەفا و مەروە یەك جار دەکرێت، کەواتە تەنانەت لە پێکەوە بوونی حەج و عومرەدا تەوافی سەفا و مەروە یەك جار پێویستە و لەسەرت لادەچێت، لە ڕووی حوکمیش ناگاتە تەوافی کەعبە کە بە دڵنیایی حەوتە و هیچی لێ زیاد ناکرێت.

# سەرتاشین یاخود کورت کردنەوە

لەپاش تەواو بوونی تەوافی سەفا و مەروە واجبی کۆتایی عومرە ماوە پێش لەخۆکردنەوەی بەرگی ئیحرام، واتە نابێت ئیحرام لابرێت تاوەکو سەرتاشین یاخود کورتکردنەوەی ئەنجام دەدرێت، ئەگەر کەسێك بە هەڵە و نەزانین لایبرد، دەبێت لەبەری بکاتەوە و پاشان سەری بتاشێت.

* پێویستە ئەگەر سەر بتاشرێت یاخود کورت بکرێتەوە، لە هەموو سەر بگیرێت یاخود بتاشرێت نەك چەند تەڵێك لە مووی سەر ببڕێ، ئەم شێوازە واجبەکەی پێ ئەنجام نادرێت.

ئافرەتان کورت کردنەوە لە سەریان (واجبە) بە لێگرتنی قژیان بە هێندەی نینۆکی ئادەمیزاد لە هەموو خواروی قژیان یاخود پەلکەکانیان: «لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ».أبو داود (١٧٣٢).

واتە: تاشین لەسەر ئافرەتان نیە بەڵکو کورت کردنەوەیە.

وە باشترین جۆریان تاشینە بۆ پیاوان: ﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾ [الفتح: ٢٧]. خوای گەورە تاشینی پێش کورت کردنەوە باس کردووە لەو ئایەتەدا.

قَالَ رَسولَ الله ﷺ: ((اللَّهُمَّ ارْحَمِ المُحَلِّقِينَ" قَالُوا: وَالمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "اللَّهُمَّ ارْحَمِ المُحَلِّقِينَ" قَالُوا: وَالمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "وَالمُقَصِّرِينَ")).البخاري (١٧٢٧)، ومسلم (١٣٠١)، وفي رواية (ثلاثاً).صحيح ابن ماجة (٣٠٤٣، ٣٠٤٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جار (لە ڕیوایەتێك دا سێ جار) فەرمووی: خوای پەروەردگار ڕەحم و بەزەیی بکە بەوانەی سەریان تاشیوە لە کۆتا جاردا دوعای بۆ ئەوانە کرد کە لە سەریان گرتووە.

وە سونەتە لە لای ڕاستەوە دەست پێ بکرێت بە تاشین یاخود کورتکردنەوە.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك رضي الله عنه: ((...ثُمَّ قَالَ لِلْحَلَّاقِ خُذْ وَأَشَارَ إِلَى جَانِبِهِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ الْأَيْسَر)).مسلم (١٣٠٥).

واتە: پێغەمبەر ﷺ بە سەرتاشەکەی فەرموو: لێرەوە واتە لای ڕاست پاشان چەپ.

بەم شێوەیە دێتە کۆتایی مەراسیمی عومرە و پاشان ئیحرام لە خۆت دەکەیتەوە.

خوای پەروەردگار عومرەکەت لێ قەبوڵ بکات، پاداشتی تەواف و کارەکانت بداتەوە و تاوانت بسڕێتەوە .(عمرة مقبولة و سعي مشكورة و ذنوب مغفورة).

# تەوافی ماڵئاوایی

# (طواف الوداع)

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرَ عَهْدِهِ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ». البخاري (١٧٥٥)، ومسلم (١٣٢٧).

واتە: کەس لە مەککە دەرنەچێت تاوەکو کۆتا کاری تەوافی کەعبە نەبێت.

لە نێوان زاناکان دا ڕای جیاواز هەیە لەسەر واجب بوونی تەوافی ماڵئاوایی لەسەر کەسێك کە عومرە دەکات، هەندێك لە زانایان ڕایان وایە کە تەوافی ماڵئاوایی لە عومرەدا واجب نیە بەم بەڵگانە:

١. پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی ماڵئاوایی لە مەراسیمی حەج دا واجب کردووە.

٢. پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی ماڵئاوایی واجب نەکردووە لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە لە سوڕی مانگانەدا بوون لە کاتی بەجێهێشتنی ماڵی خوادا.

٣. زانایان ڕایان وایە کە ئەگەر کەسێك تەوافی (إضافة)ی حەجی کرد، دەتوانێت کەعبە بەجێ بهێڵێت بەبێ کردنی تەوافی ماڵئاوایی.

کەواتە تەوافی ماڵئاوایی بۆ عومرە ڕای کۆی زانایانی لەسەر نیە، لەم حاڵەتەدا باش وایە ئەم کارە ئەنجام بدرێت بۆ دەرچوون لە خیلافی نێوان زانایان، ئەگەر عومرەکار بۆی ڕەخسا و بە ئاسانی ئەنجامی دا، گەر نا ئەوە هیچ کار لە عومرەکە ناکا و تەواوە، نە تاوان و نە فیدیەشی لەسەر ناکەوێت. بڕوانە فتاوى اللجنة الدائمة ج١١ ص٣٣٤.

بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ڕای زانایانی تر لەم بارەیەوە کە دەڵێن (طواف الوداع) واجبە بۆ عومرە، ڕونکردنەوەیەکی زانای بەناوبانگی حیجاز (شیخ عثیمین) نەقڵ دەکەین.

شیخ محمد صالح العثیمین لە کتێبی (شرح الممتع ج[٧] ص[٤٠٦])، و (الجامع الأحكام فقة السنة ج[٢] ص[٣٥٩]) دا دەڵێت: «وبهذا يتبين أن القول الراجع وهو مذهب الشافعي و أبي حنيفة أنه واجب و أما مالك و الحنابلة فيرون أنه مستحب».

واتە: بەو شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە ڕای مەزهەبی شافیعی و ئەبو حەنیفە بەهێزە لە واجب بوونی تەوافی وەداع بۆ عومرە تاوەکو مەزهەبی حەنبەلی و مالیکی کە دەڵێن سونەتە.

لە پاش ئەمە دەفەرموێت: تەوافی ماڵئاوایی بۆ عومرە واجبە بەم خاڵانەی خوارەوە:

١. بەگشتی فەرمانی داوە مەککە بەجێنەهێڵن تا کۆتا کاریان تەوافی کەعبە نەبێت بۆ هەرکەسێك بە نیەتی حەج یاخود عومرە بێت بەبێ جیابوونەوە.

٢. پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پیاوەی فەرموو کە پرسیاری کرد چی بکەم لە عومرەدا؟ فەرمووی: «اصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ مَا أَنْتَ صَانِعٌ فِي حَجِّكَ». البخاري (١٨٤٨)، ومسلم (١١٨٠).

واتە: چی لە حەج دا دەکەیت لە عومرەش دا بیکە، بێگومان تەوافیماڵئاوایی لە حەج دا واجبە، کەواتە لە عومرەش دا واجبە.

٣. عومرەکار سەرەتای کارەکەی بە تەواف دەکاتەوە، پێویستە کۆتا کاریشی بە تەواف کۆتایی بێت.

٤. تەوافی ماڵئاوایی گەر بیکەن دڵنیابوون و زیادە ڕەخساندنێکە بۆ کامڵ بوونی کارە عبادەتییەکان و لە گەردن نەمان.

وە پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێت: «دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ». الترمذي (٢٥١٨)، والنسائي (٥٧١١).

واتە: واز لە کاری گوماناوی بێنە بۆ کاری دڵنیابوون.

وە دەفەرموێت: «من اتقى الشبهات فقد استبرأ لدينه وعرضه». البخاري (٥٢)، ومسلم (١٥٩٩).

واتە: ئەوەی خۆی بپارێزێت لە گوماناوییەکان ئەوە دین و کار و خۆیەتی پارێزراوە.

٥. نەبوونی بەڵگە، بەڵگە نیە لەسەر نەبوون، بە تایبەت بەڵگە گشتییەکانیش لە ئارادایە.

٦. پاشان تەوافی وەداع لە حەجی ماڵئاوایی دا (واجب) کراو حەجی ماڵئاوایی کۆتا هەواڵی حەج و عومرەیە و سڕەرەوەی پێشوەکانیەتی، کە ئەو عومرانەیە کە هەندێك لە زانایان کردویانە بە بەڵگە لەسەر نەبوونی تەوافی ماڵئاوایی تیایدا.

٧. وە عومرەی جوعرانە کە دەکرێت بە بەڵگە لەسەر تیا نەبوونی تەوافی ماڵئاوایی پێغەمبەر ﷺ نەمایەوە لە مەککەدا، وە هەرکەسێك مەراسیمی عومرەی تەواو کرد و ڕاستەو خۆ ماڵی خوای بەجێهێشت ئەوا تەوافی ماڵئاوایی پێویست نییە.

کەواتە بە گشتی تەوافی ماڵئاوایی زیادە (عبادة)ە و متمانەیەکی تەواوە بۆ مەراسیمی عومرەکە و بەڕێز و بە بەها ڕاگرتنی (عبادة) و ماڵی خوای پەروەردگارە، ئەوەش بەشێکە لە بەندایەتی و بەڕێز ڕاگرتنی شیعارەکانی خوا: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ [الحج: ٣٢].

وە عومرەش ناو براوە لای زانایان بە حەجی بچوك، بەڵام تەوافی ماڵئاوایی لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە لە ڕوخسەتی مانگانەدان واجب نیە و فیدیەشی ناوێت نە لە حەج دا و نە لە عەمرەش دا: ((أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلَّا أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الحَائِضِ)).البخاري (١٧٥٥)، ومسلم (١٣٢٨).

# الدعاء من القرآن

١. ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ [البقرة: ٢٠٠].

٢. ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ﴾ [آل عمران: ٨].

٣. ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٢٧ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ [البقرة: ١٢٨،١٢٧].

٤. ﴿رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ [آل عمران: ٣٨].

٥. ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٧].

٦. ﴿رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ [الأعراف: ٢٣].

٧. ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ﴾ [الأعراف: ١٢٦].

٨. ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ﴾ [إبراهيم: ٤١].

٩. ﴿رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا﴾ [الإسراء: ٨٠].

١٠. ﴿رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحۡضُرُونِ﴾ [المؤمنون: ٩٧،٩٨].

١١. ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ [المؤمنون: ١٠٩].

١٢. ﴿رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ [الفرقان: ٧٤].

١٣. ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ﴾ [الشعراء: ٨٣،٨٤،٨٥].

١٤. ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ [النمل: ١٩].

١٥. ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [الحشر: ١٠].

١٦. ﴿رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [التحريم: ٨].

١٧. ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٧].

١٨. ﴿رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ [الأحقاف: ١٥].

١٩. ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ٤٠ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ﴾ [إبراهيم: ٤١،٤٠].

٢٠. ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [الأنبياء: ٨٧].

# الدعاء من السنة

١. «اللهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَر». مسلم (٢٧٢٠).

٢. «اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى». مسلم (٢٧٢١).

٣. «اللَّهَم إني أَسْأَلُكَ العَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَة». الترمذي (٣٥١٤).

٤. «اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ، وَعَلَيْكَ البَلَاغُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّه». الترمذي (٣٥٢١)، وإبن ماجة (٣١٠٢).

٥. «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي، وَمِنْ شَرِّ لِسَانِي، وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي، وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي». أبوداود (١٥٥١)، والنسائي (٥٤٨٤).

٦. «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الأَخْلَاقِ، وَالأَعْمَالِ وَالأَهْوَاءِ». الترمذي (٣٥٩١)، صحيح الجامع (١٢٩٨).

٧. «اللَّهُمَّ إِنَّكَ عُفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي». الترمذي (٣٥١٣).

٨. «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمُ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ مَا عَاذَ بِهِ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَأَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ وَعَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ وَعَمَلٍ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضَاءٍ قَضَيْتَهُ لِي خَيْرًا». صحيح إبن حبان (٨٦٩)، صحيح الجامع (١٢٧٦).

٩. «اللَّهُمَّ اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا، وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا، وَلَا تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلَا تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا وَلَا مَبْلَغَ عِلْمِنَا، وَلَا تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لَا يَرْحَمُنَا». الترمذي (٣٥٠٢).

١٠. «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي هَزْلِي وَجِدِّي وَخَطَايَايَ وَعَمْدِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي». البخاري (٦٣٩٩).

١١ . «اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ». البخاري (٨٣٤)، ومسلم (٢٧٠٥).

١٢ . «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَدْمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْغَرَقِ، وَالْحَرَقِ، وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِرًا، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغًا». أبوداود (١٥٥٢)، والنسائي (٥٥٣١).

١٣ . «اللهم إني أعوذ بك من العجز و الكسل و الجبن و البخل و الهرم والقسوة والغفلة والعيلة و الذلة والمسكنة وأعوذ بك من الفقر و الكفر والفسوق والشقاق والنفاق والسمعة والرياء وأعوذ بك من الصمم والبكم و الجنون و الجذام و البرص وسيء الأسقام». صحيح الجامع (١٢٨٥).

١٤ . «اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا، وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا، وَرِزْقًا طَيِّبًا». النسائي في سنن الكبرى (٩٨٥٠).

١٥ . «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ». الترمذي (٣٤٨٢)، وصحيح أبي داود (١٣٨٤).

١٦. «اللهم إنا نعوذ بك من أن نشرك بك شيئا نعلمه ونستغفرك لما لا نعلمه». صحيح الترغيب (٣٦).

١٧. «اللَّهُمَّ بِعِلْمِكَ الْغَيْبَ، وَقُدْرَتِكَ عَلَى الْخَلْقِ، أَحْيِنِي مَا عَلِمْتَ الْحَيَاةَ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا عَلِمْتَ الْوَفَاةَ خَيْرًا لِي، اللَّهُمَّ وَأَسْأَلُكَ خَشْيَتَكَ فِي الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، وَأَسْأَلُكَ كَلِمَةَ الْحَقِّ فِي الرِّضَا وَالْغَضَبِ، وَأَسْأَلُكَ الْقَصْدَ فِي الْفَقْرِ وَالْغِنَى، وَأَسْأَلُكَ نَعِيمًا لَا يَنْفَدُ، وَأَسْأَلُكَ قُرَّةَ عَيْنٍ لَا تَنْقَطِعُ، وَأَسْأَلُكَ الرِّضَاءَ بَعْدَ الْقَضَاءِ، وَأَسْأَلُكَ بَرْدَ الْعَيْشِ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَأَسْأَلُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إِلَى وَجْهِكَ، وَالشَّوْقَ إِلَى لِقَائِكَ فِي غَيْرِ ضَرَّاءَ مُضِرَّةٍ، وَلَا فِتْنَةٍ مُضِلَّةٍ، اللَّهُمَّ زَيِّنَّا بِزِينَةِ الْإِيمَانِ، وَاجْعَلْنَا هُدَاةً مُهْتَدِينَ». النسائي (١٣٠٥).

١٨. «اللهُمَّ قِنِي شَرَّ نَفْسِي، وَاعْزِمْ لِي عَلَى رُشْدِ أَمْرِي». النسائي في سنن الكبرى (١٠٧٦٥).

١٩. «اللهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ وَرَبَّ الْأَرْضِ وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ

شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ، وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ)). مسلم (٢٧١٣).

٢٠. ((اللهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا)). مسلم (٢٧٢٢).

٢١. ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالحَزَنِ، وَالعَجْزِ وَالكَسَلِ، وَالبُخْلِ وَالجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ)). البخاري (٢٨٩٣).

٢٢. ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَهْدِ البَلاَءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ القَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ)). البخاري (٦٦١٦).

٢٣. ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي بَصَرِي نُورًا، وَفِي سَمْعِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَفَوْقِي نُورًا، وَتَحْتِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَخَلْفِي نُورًا، وَاجْعَلْ لِي نُورًا)). البخاري (٦٣١٦)، ومسلم (٧٦٣).

٢٤. ((اللهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي جِدِّي وَهَزْلِي، وَخَطَئِي وَعَمْدِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ،

وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير)). البخاري (٦٣٩٨)، ومسلم (٢٧١٩).

**٢٥. ((اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ، فِي دِينِي، وَدُنْيَايَ، وَأَهْلِي، وَمَالِي، اللهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، اللهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنَ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي)).** أبوداود (٥٠٧٤)، والنسائي في سنن الكبرى (١٠٣٢٥).

**٢٦. ((اللهم إني أعوذ برضاك من سخطك و بمعافاتك من عقوبتك وأعوذ بك منك لا أحصي ثناء عليك أنت كما أثنيت على نفسك)).** صحيح الجامع (١٢٨٠).

**٢٧. ((اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، مُذْهِبَ البَاسِ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شَافِيَ إِلَّا أَنْتَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا)).** البخاري (٥٧٤٢).

**٢٨. ((اللَّهُمَّ حَسَّنْتَ خَلْقِي فَحَسِّنْ خُلُقِي)).** صحيح إبن حبان (٩٥٩).

**٢٩. ((اللهم إني أسألك الهدى و التقى والعفاف والغنى)).** صحيح الجامع (١٢٧٥).

**٣٠. ((اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك)).** صحيح الجامع (٣٠٦٣).

٣١. «اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَمِنْ تَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَمِنْ فَجْأَةِ نِقْمَتِكَ، وَمِنْ جَمِيعِ سَخَطِكَ». مسلم (٢٧٣٩).

٣٢. «اللهُمَّ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ، ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلَى دِينِك». صحيح إبن حبان (٩٤٣).

٣٣. «اللهم اكفني بحلالك عن حرامك، وأغنني بفضلك عمن سواك». الصحيحة (٢٦٦).

٣٤. «اللهم إني أسألك المعافاة في الدنيا والآخرة». صحيح الجامع (٥٧٠٣).

٣٥. «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّار». صحيح إبن حبان (٨٦٨).

٣٦. «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ». البخاري (٣٣٦٩).

## دواكارین خوای پەروەردگار سەفەری عیبادەتتان پڕ لە پاداشت و ڕەزامەندی خۆی بکات و بە سەلامەتی ڕۆیشتن و گەڕانەوەتان بێت

# ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|